# ژیان و بەسەرهاتی پێغەمبەران

# حزقیل ۞ الیسع ۞ شمویل

﴿ علیهم الصلاة و السلام ﴾

نوسینی

باوکی ڕەییان

١٤٢١ کۆچی ——————— ٢٠٠٠ زایینی

چاپی یەکەم

بسم الله الرحمن الرحيم

ان الحمد لله نحمده ونستعينه ونستغفره ونعوذ بالله من شرور أنفسنا ومن سيئات أعمالنا من يهديه الله فلا مضل له ومن يضلل فلا هادى له واشهد ان لا اله الا الله وحده لاشريك له وأشهد ان محمداً عبده ورسوله . اما بعد فان أصدق الحديث كتاب اله وخير الهدى هدي محمد صلى الله عليه وسلم وشر الامور محدثاتها وكل محدثة بدعة وكل ظلال وكل ظلالة فى النار .

ئەم جارە خوای گەورە کۆمەکمان بکات ژیانی ( حزقیل) و (الیسع) و (شمویل) دەخەیەنە بەردیدەتان زۆر بەپوختی انشاء الله وە هەوڵ دەدەین سەرچاوەکان بنوسین و ئامارژەی بۆ بکەین ، براو خوشکە بەرێزەکان ئەم سێ پێغەمبەری خوایە زۆر لە موسڵمانان

لە ژیان و بەسەرهات و بگرە ناوەکانیشیان دوور و بێ ئاگان کەبەداخەوە ئەوەش نیشانەی وورد تێنەڕوانینە لە قوئانی پیرۆز و فەرمووودە ڕاستەکانی پێغەمبەرﷺ کەئەمە بۆ خۆی دەردێکی زۆر سامناك و زەرەرمەندە ، بەرێزان ئەم سێ پێغەمبەرەی تری نێراوی خوا وەك پێغەمبەرانی ترن وەهەروەها گومانان نی یە لەوەدا وە هیچ جیاوازی یەکیان ناکەین هەموویان فەرموویانە ( سمعنا وأطعنا غفرانك ربنا اليك المصير ) وە بە

پێشەواوخۆشەویست و بۆ خوا صوڵحاویان دەزانین وەهەریەکەیان بەسەرهات و ژیانی خۆیانیان هەیە و ئەوەی لەسەرشانیان بووە لە گەیاندنی ئایینی خوای گەورە بەجێیان گەیاندووە خوی گەورە سەلات و سەلام بڕژێنێت بەسەریاندا وەئێمەش بکاتە بەڕاست شوێنکەوتەیان •

براو خوشکانی باوەڕدار خوێندنەوەو شارەزا بوونی ژیانی پێغەمبەران و بەسەرهاتیان خۆشەویستی و وەفایە بۆیان و هەروەها هۆی ناسین و شوێن کەوتنیان و چاو لێ کردنیانە ان شاء الله گەرچی هەرچەندە بنوسین لەبارەیانەوە ئێستا مافی خۆیانیان نادەینێ پێغەمبەران خوایان لێ ڕازی بێت هەڵگری ئاڵای یەکتاپەرستی و مامۆستای پەروەردە کردن و چارەساکراوانی نەخۆشی یەکان بوون وە تێکۆشەران و بانگەوازکەرانی ئایینی پەروەدگار بوون ، وەبۆیە گرنگی دەدەین بە ژیانی و بەسەرهاتییان و چاو پۆشن بین وشارەزای هەڵسوکەوتیان بین تا ئێمەش لە پاشیان هەست بە مەسئولیەت بکەین بەرامبەر ئاینەکەیان کە هەموویان ئایینیان هەر ئیسلام بووە ،ئێمەی ئومەتی محمەد ﷺ ئەو ئەرکە خراوەتە سەر شانمان وەك خوای گەورە دەفەرموێت ﴿ تامرون بالمعروف وتنهون عن المنکر ) وە هەروەها کراوین بەشاهید بەسەر ئەوانەی پێش

خۆی دەڵێت ﴿ وجعلناكم أمة وسطاً لتكونوا شهداء على الناس ويكون الرسول عليكم شهيداً ﴾ بۆیە دەبێت وریای خۆمان بین ئەمە ئەرکمانە لەدونیادا بەپێی توان و شارەزایمان وە هەوڵ بدەین ڕەفتاری شیرینی ئەم پێغەمبەرانە بچەسپێنین لە خۆمان و لە خەڵکی دا ، خوای گەورە لێمان خۆش بێت و ئەو کردەوانەی چاکن کە دەیکەین لێمان وەربگرێت و مەبەستەکانمان پاك بکاتەوەو یارمەتیشمان بدات بۆ کار کردن پێی و دڵەکانمان پاك بکاتەوە و لە موسڵمانان خۆش بێت وەهەروەها ئەو براو خوشکانەی لە پێش ئێمەوە بەباوەڕەوە ڕۆشتوون وە کۆمەکی بانگەوازکەران وتێ کۆشەرانی ئایینەکەی بێت وە ئەم کارەشم بکاتە تێ شوویەك بۆ ڕۆژی دوایی وە لێم وەربگێت لەبەرناوە جوانەکانی و سیفاتە بەرزەکانی .

(( وصلى الله على محمد وعلى أله وصحبه وسلم ))

باوکی ڕەیان

١٤٢١ هـ

## پێغەمبەر ( حزقیل ) علیه السلام

خوای گەورە و میهرەبان دەفەرموێت ﴿ الم تر الی الذین خرجوا من دیارهم وهم ألوف حذر الموت فقال لهم الله موتوا ثم أحیاهم ان الله لذو فضل علی الناس ولكن أكثر الناس لا یشكرون ﴾ (١) .

محمدی كوڕی اسحاق لە وەهب كوڕی منبە دەفەرموێت ( كالب بن یوفنا ) كە خوای گەورە ڕۆژی تەواو كرد لە دوای ( یوشع) لە پاشی ( حزقیل) بووە پێغەمبەرو جێ نیشین لە ناو ( بنی اسرائیل)ەكاندا ،( حزقیل بن بوذی ) كوڕی پیاوێكی تەمەندارو بەساڵاچوودا بوو وەئەم پێغەمبەرە ئەو كەسەیە كە پاڕایەوە لەخوای گەورە كە ئەو قەومە زیندوو بكاتەوە وەك خوای گەورە هەواڵی پێ داوین لە كتێبەكەی داو پێمان گەیشتوە

﴿الم تر الی الذین خرجوا من دیارهم وهم ألوف حذر الموت ﴾

( ابن اسحاق ) دەڵێت : ئەو قەومە لە ترسی نەخۆشی‌یەكی بڵاوو كوشندە هەڵ هاتبوون وە لە شوێنێكی زەوی دا مابوونەوە خوای گەورە پێ‌یانی فەرموو :بمرن ،هەر هەموویان دەست بەجێ مردن ، پاشان ساڵان و سەردەمێكی زۆریان بەسەرچوو ، (حزقیل) بەلایاندا تێ پەڕی و چووەسەریان كە بیری

---

(١) سورة البقرة (٢٤٣ )

لێ دەکردنەوە پاشان پێی وترا : پێت خۆشە خوای گەورە زیندوویان بکاتەوە لەبەر چاوت ؟ فەرمووی : بەڵێ ، پاشان فەرمانی پێ کرا کە بانگی ئێسکەکان بکات و داوایان لێ بکات گۆشت بپۆشنەوە و ئەندامەکانی لەشیان هەمووی یەك بگرێتەوە ، پاشان بەفەرمانی خوای گەورە بانگی لە ئێسکەکان کرد قەومە مردووە لەناوچووەکە هەموویان بەیەك جار وەك هەستانی‌یەك پیاو هەستانە سەر پێ و زیندوو بونەوە (٢)

وە هەروەها ( أسباط) لە السدی لە ( ابی مالك) وە هەروەها لە ( ابی صالح) لە (ابن عباس ) وە لە ( مره) لە ( ابن مسعود) یشەوە و لە هەندێ هاوەڵانی تریشەوە سەبارەت بە ئایەتی ﴿ الم تر الی الذین خرجوا من دیارهم وهم ألوف حذر الموت فقال لهم الله موتوا ثم أحیاهم ﴾ دەڵێن : گوندێك بووە لە (داوردان) پێش ( واسط) نەخۆشی ( طاعون) ی تێکەوت و زۆرینەی خەڵکەکە هەڵ هاتن و لە شوێنێك نیشتەجێ بوون ، بەڵام ئەوەی لە گوندەکەدا مابوونەوە تیاچوون و ئەوانی تریش بەسەلامەتی ڕزگاریان بوو بۆیە کەمیان مردن لەو نەخۆشی‌یە پاشان کە نەخۆشی‌یەکە (( طاعون )) هەڵ گیرا کۆتایی پێ هات گەڕانەوە بەسەلامەتی ، بۆیە هەندێکیان مابوونەوە لە گوندەکە و نەمردن وتیان : گەر

---

(٢) قصص الأنبیاء قصة (حزقیل ) ص ٤١٧ .

ئێمەش وەك ئەوانمان بکردایە دەماینەوە و توشی نەخۆشیەکە نەدەبووین وەئەگەر ئەم جارە نەخۆشیەکەمان تێ هاتەوە ئەوا ئێمەش لەگەڵیاندا هەڵدێین و گوندەکە بەجێ دەهێڵین ، جارێکی تر ئەو طاعونە هاتەوە ناویان ئەم جارە نزیکەی (٣٠,٠٠٠) هەزارو ئەوەندە بوون هەرهەموویان گوندیان بەجێ هێشت تاگەشتنە شیوێکی فراوان [٣]پاشان دوو مەلائیکەت بانگی لێ کردن یەکێکیان لەخوارووی شیوەکەوە ئەوی تریان لە سەرووی‌یەوە : بمرن ، پاشان هەموو یان دەستبەجێ مردن و تیاچوون و ئێسکەکانیان مایەوە ، دوای ئەوە پێغەمبەرێك بەلایاندا تێپەڕی و چووە سەریان ئەویش (حەزقیل) بوو ، بیری لێ دەکردنەوە و پەنجەکانی دەئالۆسکان بەیەکتریدا، دوای ئەمە خوای گەورە وەحی نارد بۆی : ئەتەوێت پێت نیشان بدەم چۆن زیندوویان دەکەمەوە ؟ ووتی :بەلێ ، تێروانین و بیرکردنەوەی (حەزقیل)لە قەومەکە سەرسوڕمانی بوو لە قودرەتی خوای گەورە ، پاشان پێی ووترا :بانگ بکە ، بانگی کرد : ئەی ئێسکەکان......خوای گەورە فەرمانتان پێ دەکات کەکۆببنەوە ، تاوەکو وای لێهات ئێسکەکان هەندێکیان دەفڕین بۆلای

---

[٣] بەزاراوەی (الفیح ) هاتووە واتە (فراوانی)

لاشەکانیان تاوەکو هەموویان بوونە لاشەیەکی ئێسکی ، پاشان خوای گەورە وەحی کرد بۆ (حەزقیل) بانگ بکە ، بانگی کرد ئەی ئێسکەکان ............ خوای گەورە فەرمانتان پێ دەکات کە گۆشت بپۆشن ، پاشان ئێسکەکان گۆشتیان پۆشی و دەمارو خوێن وپاشان ئەو پۆشاکانەی کە پێوەی مردبوون ئەوانیش دروست بوونەوە وچووەوە بەریان ، دوای ئەوە بە (حەزقیل) ووترا : بانگ بکە ، بانگی کرد :ئەی لاشەکان .... خوای گەورە فەرمانتان پێ دەکات هەستنەوە. هەموویان هەستانەوە . [٤]

(اسباط) دەڵێت : (منصور) دەڵێت لە (مجاهد) ە وە ، خەڵکەکە لەکاتی زیندووبوونەوەیان و هەستانەوەیان دا وتوویانە (سبحانك اللهم و بحمدك لا اله الا انت ) ، پاشان گەڕاونەتەوە بۆناو قەومەکانیان بە زیندوی ، ئەشیان زانی کە لەوەوپێش مردبوون ، وە ڕەنگی مردووی و زیندووبوونەوەیان پێوە دیار بوو تاوەکو کاتی تەواوبوونی ژیانیان هات ومردن .

وە لە (ابن عباس) ی ەی هاتووە کە ژمارەیان (٤,٠٠٠)هەزار کەس بووە ، وە هەر لەوەوە گێڕاوەتەوە کە ژمارەیان (٨,٠٠٠)

---

[٤] قصص الانبیاء ، قصه (حزقیل) ص (٤١٨) .

هەزار كەس بووە ، وە لە (ابى صالح) وە ژمارەيان (٩,٠٠٠) هەزار كەس بووە ، وە (سعيد بن عبدالعزين) دەڵێت : (انهم كانوا من اهل اذرعات) وە (ابن جرير) لە لە (عطاء) وە دەڵێت :ئەمە پەندە ، واتە : ئەم بەسەرهاتە پەندێكى ڕوونە لەسەر ئەوەى كە خۆپاراستن هيچ ڕێگرىيەك ناكات لەبەردەم قەدەردا ، وە ووتەى (جمهور) ى زانايان لەمە بەهێزترە كە وتراوە .

(وقد رواه الامام احمد و صاحبا الصحيح من طريق الزهرى ، عن عبدالحميد بن عبدالرحمن بن يزيد بن الخطاب ، عن عبدالله بن الحارث بن نوفل ، عن عبداللة بن عباس ) كە عومەرى كوڕى خەطاب دەرچوو بۆ ووڵاتى( شام ) تاوەكو گەيشت بە ئەميرى سەربازەكان (ابو عبيده بن الجراح) و هاوڕێكانى ، هەواڵيان پىدا كەوا نەخۆشى كوشندە بڵاوبۆتەوە لەشارى (شام) دا ، پاش ڕاوێژ كردنى امام عومەر بە موهاجير وئەنصارەكان بۆ چوونە ناو شارى (شامە) وە جياوازيان هەبوو لە چوون و دابەزينى امام عومەر بۆ ناو شار (عبد الرحمان بن عوف) هات پاش ئەوەى ديارنەمابوو لەوكاتەدا بەهۆى ئەنجامدانى هەندێ پێويستى خۆيەوە ، ووتى : من لەم بارەيەوە زانيارىم پێيە ، گوێم لەو پێغەمبەرى خوا بووە فەرموويەتى (ئەگەر نەخۆشىيەك لەشوێنێكدا بڵاوبووەوە و ئێوەش لەوێ بوون دەرمەچن

بەمەبەستی ڕاکردن لێی ، وە ئەگەر هەواڵتان پێگەیشت کەلە شوێنێکدا هەیە ئەوا مەچن بۆی ) امام عومەر سوپاسی خوای کرد و پاشان گەڕایەوەو ڕۆیشت . وە هەر لە (امام احمد)ە وە : حدثنا حجاج ويزيد المفتی قالا : حدثنا ابن ابی ذؤيب عن الزهری ، عن سالم ، عن عبدالله بن عامر بن ربيعه كه عبدالرحمن کوڕی عوف لە شام بوو هەواڵی دا بە امام عومەر کە لە پێغەمبەری خوای بیست بوو ، ئەم دەرد و نەخۆشی‌یە سزایەك بووە خوای گەورە ئومەتانی پێشینانی پێ سزا داوە ، ئەگەر هەواڵتان پێ گەیشت ئەو نەخۆشی‌یە لە شوێنێکدا بڵاوبووەتەوە مەچنە ئەو ناوچەیە وە ئەگەر کەوتە شوێنێك و ئێوە ی تیا بوون لێی مەیەنە دەرەوە بەمەبەستی هەڵهاتن لێی . دەڵێت : امام عومەر گەڕایەوە و نەچووە شام [1]

(ابن اسحاق ) دەڵێێت : ماوەی مانەوە ی (حەزقیل ) لە نێو (بنی اسرائيل ) بۆمان باس نەکراوە و پاشان خوای گەورە کۆتای بەژیانی هێناوە ، دوای وەفاتی (حەزقیل) ( بنی اسرائيل) ئەو عەهدەی دابویان بە خوای گەورە لەبیریان کرد و خراپەکاری گەورە لە نێوانیان د ابڵاوبۆیەوە وڕوویان کردە بتەکانیان ، یەکێك لەو بتانە ی دەیان پەرست بتێك بە ناوی (بعل) بوو ،

---

[1] واخر جاه من حديث مالك عن الزهری بنحوه

پاشان خوای گەورە (الیاسی کوڕی یاسینی کوڕی فنحاصی کوڕی العیزاری کوڕی هارونی کوڕی عمران)ی بۆناردن .

(ابن اسحاق )دەڵێت:لەوەی کە ( وهب بن منبه) بۆی گێڕاوەتەوە : لەدوای (الیاس) (الیسع بن اخطوب) علیه السلام بووە جێ نشینی و پێغەمبەر بۆ (بنی اسرائیل)، والله تعالی اعلم

پێغەمبەر (الیسع ) (علیه السلام)

خوای گەورە ناوی ئەم پێغەمبەرەی بردووە لە سوورەتی (الانعام) کە دەفەرموێت (و الیسع و یونس و لوطا، وکلا فضلنا علا العالمین )[1] وە هەروەها لە سورەتی (ص) دا دەفەرموێت (واذکر اسماعیل والیسع وذاالکفل، و کلا من الاخیار )[2] ابن اسحاق دەڵێت : ﴿ حدثنا بشر ابو حذیفة ، انبأنا سعید عن قتادە ،عن الحسن .، قال : لەپاش ( الیاس) ( الیسع) ە لەدوای هات (علیه السلام ) ماوەیەك مایەوە و بانگی دەکردن بۆ لای پەروەردگار و دەستی گرتبوو بە بەمەنهەج و شەریعەتی ( الیاس) ەوە هەتاوەکو خوای گەورەو ڕۆژی تەواو کرد پاشان جێ نشین لەناویاندا دەستی پێ کرد و هەڵە و تاوانی گەورە لەناویاندا بڵاو بوویەوە ، وە زۆردار لەناویاندا زۆربوو .وە پێغەمبەرانیان دەکوشت ،

---

[1] سورة (الأنعام) :٨٦

[2] سورة (ص) : ٤٨

وپاشایەکیان تیایدا بوو ، زۆر دڵ رەقە و ئینکار بوو ، دەڵێت : ئەوکەسە بووە کە ( ذوالکفل) دادوەری بۆ کردبوە جا ئەگەر تەوبەی کردبێت ، گەڕابێتەوە ئەوا چۆتە بەهەشتەوە ( محمدبن اسحاق ) دەڵێت : ( الیسع بن خطوب ) ە.

وە ( الحافظ ابو بن القاسم عساکر ) لە ( تأریخه ) دەڵێت : (الیسع) (اسباط) ی کوڕی _عدي )کوڕی _ شوتلم )کوڕي (افرئیم ) کوڕي ( یوسف) کوڕي ( یعقوب) کوڕي ( اسحاق ) کوڕی پێغەمبەر ( ابراهیم ) ە ، وەوتراوە : کوڕی مامی پێغەمبەر (الیاس ) ە علیهم السلام ، وە دەڵێت : پێکەوە خۆیان حەشاردابوو لە شاخی ( قاسیون ) لە ترسی پاشایەك لە (بعلبك) پاشان لەگەڵیدا ڕۆشتوە دوای ئەوە کە خوای گەورە ( الیاس )ی مراند (الیسع) لە دوای هات بۆقەومەکەی خوای گەورە کردی بە پێغەمبەر .

(ابن جریر ) و غیره دەڵێت : کاروباری بنی اسرائیل کەوتە لێژی و کەوتنە تاوان ئەنجام دان و دەستیان کرد بە کوشتنی پێغەمبەران ، خوای گەورە کۆمەڵێك دەسەلات دارو پاشایانی زاڵ کرد بەسەریاندا لەبری پێغەمبەران وە ئەم دەسەلاتدارانە کەوتنە ستەم و خوێن ڕێژی بەسەریانەوە ، وەهەروەها خوای گەورە دوژمنانی دەرەوەی خۆشیانی هەروەها زاڵ کرد بەسەریاندا ،

وەئەگەر بکەوتنایەتە جەنگ و کوشتار کردن ئەو تابوتەی کەلەپاش ( موسی ) و (هارون) بەجێ مابوو کە خوای گەورە ( سەکینە )ی بەهۆیەوە بۆ دادەبەزاندن ئەو تابوتەیان دەبرد لەگەڵ خۆیاندا بەهۆی ئەوتابوتەوە بەرەکەتی سەرکەوتنیان بۆ دەستەبەر دەکرا ، وە کاتێك کەلە هەندێ جەنگدا لەگەڵ ئەهلی ( غەزە) و( عسقلان) کەبەسەریاندا زاڵ بوون ، ئەوتابوتەیان لێ سەندن و لەدەستیان بۆیەوە ،کاتێك ، پاشای بنی اسرائیل ئەمەی زانی لەو سەردەمەدا ملی هات بەلاداو مرد .

وەبنی ئیسرائیل بەپێی سەروکار مانەوە وەك مەڕی بێ شوان تاکو خوای پەروەردگار پێغەمبەرێکی بۆ ناردن بەناوی ( شمویل) پاشان داوایان لی کرد کە پاشایەکیان بۆ دیاری بکات تاوەکو بجەنگێن لەگەڵ دوژمنەکانیان دا ، ( ابن جریر) دەڵێت کاتیب مردنەکەی ( یوشع) کوڕی ( نون) تا ئەو کاتە بوو کە خوای پەروەردگار ( شمویل بن بالی) بۆ ناردن کەئەو ماوەیە دەکاتە (٤٦٠) ساڵ ، وەپاشان ( ابن جریر) یەکە یەکە ناوی ئەو پاشایانەی هێناوە کە بوون بە پاشا بەسەر بنی اسرائیل وە .

## پێغەمبەر ( شمویل ) علیه السلام :

ناوي ( شمویل) ە وە وتراوە ( اشمویل ) کوڕی (بالي ) کوڕی ( علقمة) کوڕی ( یرخام) کوڕی( الیهو) کوڕی ( تهو ) کوڕی

(صوف) کوڕی ( علقمة ) کوڕی ( ماحث) کوڕی ( عموصا) کوڕی ( عزریا ) •

( مقاتل) دەڵێت : لەوەرەسەی ( هارون )ە ، وە (مجاهد) دەڵێت : (اشمویل) ی کوڕی (ملفاقا) یە ، وەلەمەزیاتر ڕەچەڵەکی نەهاتووە والله اعلم .

(السدی) گێڕاوییەتەوە اسنادە لە (ابن عباس) و (ابن مسعود) وە خەڵکانێك لە هاوەڵان وە هەروەها لە (الثعلبي ) و جگە لەویش : یەکێك لە زۆردارانی (غزە) و (عسقلان) زاڵ بوون بەسەر بنی اسرائیل دا لەو جەنگەدا پاش ئەوە خەڵکانێك زۆریان لەبنی اسرائیل کوشت وە خراپەیان لەگەڵ نەوەکانیاندا کرد زۆریان ، پاشان پێغەمبەرایەتی وەستا لەناویاندا لەو هۆزی ( سبط لاوي) یە کەس دەرنەچوو تەنها ئافرەتێك نەبێت .

پاشان ئەو ئافرەتە زۆر پاڕایەوە لەپەروەردگار کەوا کوڕێکی پێ ببەخشێ ، پاشان خوای گەورە وەڵامی پاڕانەوەکەی دایەوە ، کوڕێکی پێ بەخشی و ئافرەتەکە ناو ی نا ( اشمویل) وە مانای ئەم ناوە بە ( عبرانی ) ئەوە دەبەخشێت ( اسماعیل) واتە خوای گەورە گوێی لە دوعاکەم بوو .

دوای ئەوەی گەورە بوو دایکی ناردی بۆ پەرستگا وە دایە دەست کابرایەکی ( صالح) ی کرد بۆ ئەوەی فێری خواپەرستی

و چاکە ببێت ، لای مایەوە ، دوای ئەوەی تەواو پێ گەیشت وگەورە بوو شەوێك خەوتبوو دەنگێك لەشوێنێکی پەرستگاکەوە بانگی لێ کرد ئەو یش بەخێرا ئەناگا هاتەوە و وای زانی کە مامۆستاکەی بانگی دەکات بۆیە پێی ووت : تۆ منت بانگ کرد ؟ ئەویش پێی خۆش نەبوو بترسێ ووتی: بەڵێ .... بخەوە ئەویش خەوتەوە پاشان جاری دووەم هەر بەهەمان شێوە و جاری سێیەمیش بەهەمان شێوە ، (جبریل) بوو علیە السلام بانگی دەکرد پاشان هات بۆ لایی و پێی فەرموو : خوای پەروەردگارت تۆی ناردووە بۆ قەومەکەت ، پاشان ، ئەو ڕووداوانەی ڕووی دا لەگەڵ قەومەکەی کە خوای گەورە باسی کردووە لە قورئاندا .

خوای گەورە دەفەرموێت ﴿ ألم تر إلى الإملاء من بني إسرائيل من بعد موسى إذ قالوا لنبي لهم ابعث لنا ملكاً نقاتل في سبيل الله قال هل عسيتم إن كتب عليكم القتال إلا تقاتلوا ، قالوا وما لنا إلا نقاتل في سبيل الله وقد أخرجنا من ديارنا ،وأبنائنا ، فلما كتب عليهم القتال تولوا إلا قليلاً منهم ، والله عليم بالظالمين ، وقال لهم نبيهم إن الله قد بعث لكم طالوت ملكاً ، قالوا أنى يكون له الملك علينا ونحن احق بالملك منه ، ولم يؤت سعة من المال قال ان الله اصطفاه عليكم وزاده بسطة فى العلم و الجسم و الله يؤتى ملكه من يشاء والله واسع عليم . و قال لهم نبيهم ان اية ملكه ان ياتيكم التابوت فيه سكينة من ربكم و

بقية مما ترك ال موسى و ال هارون تحمله الملائكة ان في ذلك لاية لكم ان كنتم مؤمنين . فلما فصل طالوت بالجنود قال ان الله مبتليكم بنهر فمن شرب منه فليس مني و من لم يطعمه فانه مني الا من اغترف غرفة بيده ، فشربوا منه الا قليلا منهم ،فلما جاوزه هو و الذين امنوا معه قالوا لا طاقة لنا اليوم بجالوت و جنوده ، قال الذين يظنون انهم ملاقوا الله كم من فئة قليلة غلبت فئة كثيرة باذن الله و الله مع الصابرين ، و لما برزوا لجالوت و جنوده قالوا ربنا افرغ علينا صبرا وثبت اقدامنا و انصرنا على القوم الكافرين ، فهزموهم باذن الله و قتل داود جالوت و اتاه الله الملك و الحكمة و علمه مما يشاء ، و لولا دفع الله الناس بعضهم ببعض لفسدت الارض ولكن الله ذو فضل على العالمين (١)

زۆرینەی ئەهلی تەفسیر دەڵێن : ئەو پێغەمبەری قەومەی کە باس کراوە لەم ئایەتانەدا (شمویل)ە ، ووتراوە :(شمعون ) ە وە دەڵێن : هەردووکیان یەك کەسن ، وە وتراوە : (یوشع ) ە ، بەلام ئەمەیان زۆر دوورە لە راستی‌یەوە بەو بەڵگەیەی کە (امام ابو جعفر بن جریر ) باسی کردووە لە (تاریخە ) ەکە، دەڵێت : نێوانی مردنی (یوشع )لەگەڵ ناردنی (شمویل) چوارسەدو شەست ساڵە (٤٦٠) ...والله تعالى اعلم .

---

[1] سوره البقره ، ٢٤٦ -٢٥١.

ئەوەی لێرەدا مەبەستە ئەوەیە کەئەم قەومە پاش ئەوەی جەنگ لەناوی بردون و فەوتانوونی و دوژمنان زاڵ بوون بە سەریاندا ، داوایان کرد لەپێغەمبەرەکەیان کە سەرکردەیەکیان بۆ دەست نیشان بکات بێتە پێشەوای جەنگیان تا لە دوای ئەم پێشەوایەیانەوە جەنگ بکەن و تۆڵەی خۆیان بکەنەوە ، ئەویش پێی ووتن (**هل عسیتم ان کتب علیکم القتال الا تقاتلوا ، قالوا و ما لنا الا نقاتل فی سبیل الله** ) واتە : چ شتێك دەبێتە ڕێگر تا کوشتار نەکەین (**و قد اخرجنا من دیارنا و ابنائنا**) وە دەیان ووت : ئێمە جەنگمان لەگەڵ کراوە و لێمان کوژراوە ، بۆیە ڕاست ئەوەیە بجەنگێن و پارێزگاری لەنەوەکانمان بکەین و ئەو منالآنەمان ڕزگار بکەین کە بێ دەسەلآت ماونەتەوە لە ژێر دەستی دوژمناندا .

خوای گەورە دەفەرمێت (**فلما کتب علیهم القتال تولوا الا قلیلا منهم ، و الله علیم بالظلمین** ) کاتێك مۆڵەت و لە سەریان نووسرا جەنگ کردن زۆریان پشتیان تێ کرد و خوای گەورەش زانایە بە ستەمکاران ، وە هەروەها لە شوێنی پەڕانەوەی ڕووبارەکەش باس کراوە کە کەمێکیان نەبێت پەڕیونەتەوە لەگەڵیدا.

(**و قال لهم نبیهم إن الله قد بعث لکم طالوت ملکاً** ) ( **الثعلبي** ) دەڵێت : ئەوە ( طالوت ) ی کوڕی ( قیس ) کوڕی ( الفیل ) کوڕی

( حارو ) کوڕی ( تحورت) کوڕی (افیح) کوڕی ( أنیس ) کوڕی ( بنیامین) کوڕی ( یعقوب) کوڕی ( اسحاق ) کوڕی پێغەمبەر ( ابراهیم ) ە علیە السلام

( عکرمە ) و (السدی) وتویانە : ئاو گێڕبووە ! وە (وهب بن منبە) وتویەتی : (دباغاً) پێستە پاکەربووە ، وە جگە لەمانەش شتی تر وتراوە .. .. واللە تعالی اعلم .

لەبەر ئەمەش بوو دەیان ووت : ( قالوا أنی یکون لە الملك علینا ونحن أحق بالملك منة ولم یؤت سعة من المال ) واتە چۆن دەبێت ببێت بەدەستەڵات دار بەسەر مانەوە کاتێك ئێمە لەپێش تر و هەقتر وایە بۆ ئێمە بێت ئەو دەسەڵاتە وە ئەو سەروەتی زۆری نی یە ، وە ئەوەشیان دەووت کەوا (سبط لاوی ) پێغەمبەرایەتی تیا بووە و موڵك و دەسەڵاتیش لە (سبط یهوذا) دا بووە ن وە ئەمیش لە نەوەی (بنیامین ) ە و جیاوازە و دەستیان کرد بە قسە پێ ووتنی لە دەسەڵاتەکیدا بەسەریاندا و ووتیان : هەق وایە بۆ ئێمە بێت و ئێمە لە پێشترین بۆ دەسەڵات و هەروەها ئەوەشیان ووت کەوا کابرایەکی کەم دەرامەتە وچۆن دەبێ بکرێتە دەسەڵات دار

ووتی : ( قال ان اللە اصطفاه علیکم وزاده بسطة فی العلم والجسم )ووتراوە : خوای گەورە وەحی کرد بۆ (شمویل)ەکە درێژی ئەو کەسە لە ئاستی درێژی ئەو عەصایەیە وە ئەگەر هاتە

لات ئەوسەردەمە دەگۆڕێت لە بەزیوی و ئەوە کەسە دەبێتە دەسەلأت دار ، پاشان هەموویان دەرچوون و خۆیان دەپێوا بەو دارە و کەسیان بەئاستی درێژی دارەکە نەدەبوون جگە لە (طالوت) نەبێت ، دوای ئەوەی کە چوەلای (شمویل) کردی بەدەسەلأت دار و پاشا بەسەر ( بنی اسرائیل) ە وە و پیێی ووتن : ( ان الله اصطفاه علیکم و زاده بسطة فی العلم و الجسم ) ووتراوە : لە بارەی جەنگەوە لێزان بووە ، وە ووتراوە بەڵکو لە بارەی لاشەشەوە بە (مطلق)ی (و الجسم )ووتراوە :درێژی ، وە وتراوە : لە جوانی دا ، وە دیاری بەڵگەکان ئەوەیە کە لە هەموویان جوانتر و زاناتر بووە پاش پێغەمبەروکەیان علیە السلام (و اللة یؤتی ملکة مکه من یشائ ) فله الحکم و له الأمر و الله سمیع علیم ).[1]

( وقال لهم نبیهم إن أیة مولکه أي یاتیکم التابوت فیه سکینة من ربکم وبقیة مما ترك آل موسی وال هارون تحمله الملائکة ، إن في ذلك لإیة لکم إن کنتم مؤمنین ) ئەمەش بیەکێك بوو لەو بەرەکەتانەی ئەو پیاوە چاکە کرا بەپاشایان ، کەبۆیان بگەرێتەوە وە ئەو تابوتەی لەدەستیان سەنرابوو لە کاتی جەنگدا ، دوژمنانیان بەوە لەناوی بردوبوون ، بەهۆی ئەمەوە سەرکەوتنیان بەدەست دەهێنا بەسەر دوژمنەکانیاندا ( فیه سکینة من ربکم ) وتراوە : تاسێکی

---

[1] ئایەت نیە بەڵکو ووتەی ( ابن کثیر )ە

ئـاڵتونی تیـادا بـووە کەسـنگی پێغەمبـەرانی تیـا شـۆراوە ، وەوتـراوە ( السـکینە) وەك بایـەکی تونـدی ڕۆشـتوو وایـە ، وەوتراوە : شێوەی ڕەسمەکەی وەك پشـیلەیەك وابـووە لـەکاتی جەنگدا دەنگی لـێ بهاتایە بەنی ئیسرائیل یەقینیان دەبوو بـە سەرکەوتن ، ( وبقیة مما تـرك ال موسـی وال هـارون ) وتـراوە: ( کان فیه رضاض الالواحي و شيء من المن الذي کان نزل عیهم بالتیـه )
واتـە: ( هەندێ پاشماوەی ئەو لەوحانـەی تیا بـووە کـە خـوای گەورە ئامۆژگاری ڕێنمویی کردنـی ئەو کاتـە بۆ موسی کردبوو لەو لەوحانەدا ، لەگەڵ هەندێك لەجۆرە گەزۆ لـەو کاتـەدا دابەزی بۆیان لەناوچەی ( التیە) .
( تحملـه الملائکة ) واتـە: مەلائیکەتـەکان بۆتانی ئەمێنن هـەڵیان گرتـووە وە ئێـوەش ئـەوە بـەچاوی خۆتـان ئـەبینن بـۆ نمونـەو پەندی خوای گەورە بەسەرتانەوە بێت وە حوجەیەك بێت لەسەر ڕاستی ئەوەی پێتـان دەڵێم وەت هـەروەها لەسـەر ڕاسـتی دەسـت نیشـان کردنـی ئـەو پیـاوە بەدەسـەڵاتدار بەسـەرتانەوە بۆیـە لەدواییدا دەڵێت ( ان في ذلك لآیة لکم ان کنتم مؤمنین )
ووتـراوە :کـاتێك سـتەم کـاران زاڵ بـوون و جـەنگیان بـردەوە و دەسـتیان گـرت بەسـەر ئـەو تابوتـەدا کە زۆر مبارەك بـوو چونکـە سەکینەر هەندێ شتی تری تیادا بوو کە پاشماوەی مبارەك بوو

، ووتراوه : هەروەها ( تورات)ی تیادا بووه ، پاشان کە کەوتە دەستیان خستیانە ژێر بتێك لەو بتانەی دەیان پەرست لە خاکی خۆیاندا دوای ئەوەی کە بەیانیان کردوه ، تابوتەکە لەسەر سەری بتەکەدا بوو ئەوانیش خستیانەوە ژێر بتەکە پاشان ڕۆژی دووەم بەهەمان شێوە تابوتەکە خرابوویەوە سەر بتەکە و ئەوانیش خستیانەوە ژێر بتەکەیانەوە ، دوای ئەوە ڕۆژی سێهەم بەهەمان شێوە و ئەم ڕووداوە هەر دووبارە دەبووەیەوە بۆیە بەوەیان زانی کەوا ئەمە فەرمانێکەو وویستی خوای گەورەیە بۆیە لەشارەکەی خۆیان بردیانە دەرەوە و لە گوندێك لە گوندەکانی خۆیاندا یان نا و پاشان توشی دەردێك بوون لەملیاندا کە ئەمەش هەر بەردەوام بوو کردنیانە سەروو چەرخی‌یەك و بەدوو مانگاوە ڕەوانەیان کردەوە ، وەوتراوە : مەلائیکەتەکان لێیان دەخوڕین تاوەکو گەیشتن بەدەستی کۆمەڵێك لە بنی ئیسرائیل کە سەیریان دەکرد وەك چۆن پێغەمبەرەکەیان پێی ڕاگەیاندن ، بەڵام خوای گەورە زانایە کە چۆن مەلائیکەتەکان هێنایانەوە ، وەظاهری ئایەتەکەو تێ گەیشتنی ئەوەیە کە مەلائیکەتەکان هەڵیان گرتبوو خۆیان ، والله اعلم گەر چی ئەوەی یەکەمیان زۆربەی موفەسرین گێڕاویانەتەوە .

( فلما فصل طالوت بالجنود قال ان الله مبتليكم بنهرٍ فمن شرب منه فليس مني ومن لم يطعمه فانه مني الا من اغترف غرفة بيده ) ابن عباس و زۆربەی موفەسرین دەڵێن : ئەو ڕووبارە ڕووباری ( ئەردەن ) بووە ، وەیەکێك لەفەرمانەکانی طالوت بۆ سەربازەکانی ئەم ڕووبارە بوو کە ئەویش فەرمانی پێغەمبەرەکەیان بووە و بەفەرمانی خوای گەورە تاتاقییان بکاتەوە فەرمانەکەش ئەوەیە کەهەر کەس لەم ئاوە بخواتەوە لەگەڵماندا نایەت بۆ ئەو جەنگە ، وەکەس شوێنی ناکەوێت ، جگە لەو کەسانەی کە نایخۆنەوە یان کەسێك لەمشتیدانادا چێش دەکەن .

خوای گەورە دەفەرموێت : ( فشربوا منه الا قليلاً منهم ) (السدی) دەڵێت : ( جەنگاوەرەکان( ٨٠,٠٠٠ )هەزار کەس بوون ، بەڵام ( ٧٦,٠٠٠) یان لە ڕووبارەکەیان خواردەوەوە پاشان (٤٠٠٠) کەسیان لێ مایەوە .

وقد روى البخاري في صحيحه من حديث اسرائل وزهير والثوري ، عن ابى اسحاق ، عن البراو بن عازب قال : ( ئێمەی هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ گفتوگۆمان دەکرد لەبارەی ژمارەی ئەو کەسانەی بەشداری ( بدر) یان کردبوو کە ژمارەیان وەك ژمارەی ئەو کەسانە بوون لەگەڵ ( طالوت) دا لە ڕووبارەکە پەڕینەوە؛

وەئــەوەی پەیڕییــەوە لەگــەڵیدا تەنــها ( ٣١٠) و شــتێك زیــاتر باوەڕدار بوون ، وەووتــەی ( الســدی) کەفەرموویــەتی ژمــارەی سەربازەکانی ( طالوت) (٨٠٠٠) کەس بووە ( فیە نظر) ، چونکە خــاکی ( بیــت المقـدس) ی ئــەو کاتــە توانــای جــێ بوونــەوەو کۆبوونەوەی ئەم ژمارە سەربازە نییە . .. والله تعالی اعلم .

خوای گەورە دەفەرموێت ( **فلما جاوزە هو والذین أمنوا معــە قــالوا لا طاقة لنا الیوم بجــالوت وجنـودە** ) واتە :خۆیان بە بێ هێزو کەم زانــی وەهــەروەها ئەوەشیان ڕاگــەیاند کــە توانــایی بــەرگری و ڕووبەڕووبونــەوەی دوژمنــەکانیان نییە ، بــەو ئاســتەی کەئــەمان کەمن وە دوژمنەکانیان زۆرن . ( **قال الذین یظنـون انـهم ملاقـوا الله کم من فئة قلیلة غلبت فئةً کثیرةً باذن الله والله مع الصابرین** ) واتە : ( جێگیری کــردن و ئازایــەتی و شۆڕەســواری و ئــەهلی بــاوەڕو وەئارام گر دەبن لەسەر ناخۆشی و ئازارو ئەشکەنجە .

( **ولما برزوا لجالوت و جنودە قالوا ربنا افرغ علینا صبرا و ثبت اقدامنــا و انصرنــا علــی القــوم الکــافرین** ) داوایــان کرد لــە خــوای گــەورە کەئارام گری و خۆ ڕاگریان پێ ببەخشێ ، واتــە خــوای گــەورە دایان بپۆشێت بە ئارام گــری و لــە ســەرەوەیان دایبــەزێنێت تــا دڵەکانیان جێگیر بێت و لە ڕاڕای بکەوێت ، وە پێکانیان جێگیر بکات لــە کــاتی جــەنگ دا ، داوایــان کــرد کــە خۆڕاگــری نــاردوە

ودەرەوەیـان پێ‌ببەخشـێت وە سـەرکەوتنیان بـۆ بێـت بەسـەر دوژمنەکانیاندا ،( ئەوانەی باوەڕناهێنن بە خوا و ئایەتـەکانی ) خوای گەورە پاڕانەوەکەیانی وەرگرت و سەرکەوتنی پێ بەخشین بۆیە خوای گەورە دەفەرموێت ﴿ فهزموهم بـاذن الله ﴾ بـەهێز و ویستی خوای پەروەدگار نەك بە کۆششی خۆیان ، وە بەهێزو سەرکەوتنی خوای گەورە نەك بەهێزو بەژمارەی خۆیان ، کە لـە کاتێکدا دوژمـەکانیان لەوپـەڕی تـەواوی ژمـارەدا بـوون ، وەکـو خوای گـەورە دەفـەرموێت ﴿ ولقـد نصركم الله ببـدرٍ وأنتـم أذلـة ، فاتقوا الله لعلكم تشكرون ﴾ [1]

خوای گـەورە دەفـەرموێت ﴿ وقتـل داود جـالوت وأتـاه الله الملـك والحكمة وعلمـه ممـا يشـاء ﴾ ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئازایەتی ( داود) کوشـتنێکی زۆر سەرشـۆڕ کـردن کوشـتویەتی ، و سەربازەکانی پێ هەڵ هاتن کردووە ، وە هیچ شتێك لەوە خۆش تر نی‌یە کەلە جەنگدا پاشاکە بکوژرێت و بەهۆیەوە دەستکەوتی زۆر ببێـت و ئازایـان و پاڵـەوانان بـەدیلی بگـیرێن ، ووشـەی پـەروەردگار بدرێـت بەسـەر بـت و دارو دەسـتەکەی دا و هـەق و چاکە خوازی دەربکەوێت و بالآ دەست بێت .

---

[1] سورة آل عمران : ١٢٣

( السدی) گێڕاویەتەوە : کە (داود) بچوکترینی کوڕی باوکی بووە ، کە (١٣) کوڕ بوون ، (داود) لە کاتی جەنگدا گوێی لە (طالوت) بوو سەربازەکانی هان دەدا بۆ کوشتنی ( جالوت) و دەیووت: هەر کەس جالوت بکوژێت کچەکەمی دەدەمێ و هاوبەشی دەکەم لە دەستەڵاکەمدا ، (داود) لەسەر ئامێری بەرد هاویشتن بوو کە شارەزای‌یەکی تەواوی هەبوو تیایدا ، کاتێك کەبەڕێوە بون ، بۆ جەنگەکە لەگەڵ بنی ئیسرائیل دا گوێی لەبەردێك بوو بانگی لێ کردووە ووتی بمبەلەگەڵ خۆتاد بەمن ( جالوت) دەکوژرێت ، ئەویش ئەو بەردەی هەڵ گرت و پاشان بەردێکی تر بەهەمان شێوە بەردی سێ‌هەمیش بەهەمان شێوە ، پاشان کاتێك هەردوو سوپاکە بەیەك گەیشتن (جالوت ) هاتە دەرێ و بانگی کردو ( داود ) چووە دەرێ بۆ بەڵام ( جالوت ) پێی ووت: بگەڕێرەوە پێم ناخۆشە کوشتنی تۆ ، ئەویش ووتی : بەڵام من حەز بە کوشتنی تۆ دەکەم ، پاشان هەرسێ بەردەکەی خستە ناو ئامێری برد هاویشتنەکەوە و ڕووی کردە ( جالوت) و بەردەکان هەرسێ‌کیان بونە یەك بەردی سەخت ، پاشان بەردەکەی هاویشت و دای بەسەر ( جالوت) داو کردی بەدووبەشەوە سەری ، وەدوای دا ( طالوت) بەڵێنەکەی بۆ بردە سەرو کچەکەی خۆی پێ داو لە دەستەڵاتەکەی هاوبەشی کردوو ( داود) بویە

پیاوێکی ناودارو خۆشەویست لەناو بنی اسرائیل داو تارادەیەك خۆشیان دەویست لە (طالوت) زیاتر،باس کراوە کە (طالوت) حەسوودی پێ دەبرد تاوای لێ هات چەند جار دەیویست بیکوژێ بەڵام دەستی پێی نەدەگەیشت ، زاناکانیان ڕێی گری ئەم کارەیان لە ( طالوت) دەکرد تاوای لێ هات ( طالوت) کەوتە کوشتنی زاناکان بە ئاستێك زۆر کەم لە زاناکان بە زیندووی مانەوە پاش ئەمە ( طالوت) پەشیمان بووەوەو تەوبەی کرد و وازی لەو خراپەکارییە هێنا و زۆر دەگریا و دەچوو بۆ گۆڕستان ئەوەندە دەگریا تا زەوییەکەی تەڕ دەکرد ، ڕۆژێك بانگ کرا لە گۆڕستان : ئەی طالوت.. ئێمەت کوشت کە زیندووبووین وە ئازارمان دەدەیت کەمردووشین ، لەمەوە گریانەکەی زیادی کردوو دڵی زیاتر بەپەرۆش و تەنگ تر بوو ، پاشان دەگەڕا پرسیاری زانایەکی دەکرد تا پرسیاری لێ بکات کەتەوبەی وەردەگیرێتی و قبوڵ دەبێت ؟ پێیان ووت: جا تۆ زانات هێشتووە بە زیندووی ؟!تاوەکو ئافرەتێکی خواپەرستیان پێ نیشان داو دەستی گرت و لەگەڵ خۆیدا بردی بۆ گۆڕستانەکە و بۆ لای گۆڕی ( یوشع) علیه اسلام ، دەڵێن : ئافرەتەکە پاڕایەوە لە خوای گەورە تاوەکو ( یوشع) هەستایەوە لەگۆڕەکەیدا ، وتی : قیامەت هاتووە ؟ ئافرەتەکە ووتی : نەخێر ، بەڵام ئەمە

( طالوت)ە و پرسیارت لێ دەکات ئایا تەوبەی بۆ هەیە ؟ ئەویش وتی: بەڵێ دەست بەرداری پاشایەتی ببێت و بڕوات بجەنگێت لە پێناوی پەروەردگاردا تاوەکو دەکوژرێت ، پاشان ( طالوت) دەرچوو بۆ جیهاد کردن تاوەکو کوژرا بە مردووی گەڕایەوە ٠ دەستەڵاتەکەی بۆ (داود ) بەجێ هێشت و خۆیی و (١٣) کوڕی دەرچوون بۆ کوشتارکردن لە پێناوی خوادا تاوەکو کوژرا ، دەڵێن : ئەوەیەکە خوای گەورە دەفەرموێت ﴿ وأتاه الله الملك والحكمة وعلمه مما يشاء ﴾ بەم شێوەیە ( ابن جرير) لە ( تأريخه) گێڕاویەتەوە لە ڕێگای ( السدي ، باسناده) ، بەلام لە هەندێ شتی دا تێ ڕوانین ( وانەبوون) هەیە .. والله تعالى اعلم .

وە محمد بن اسحاق) دەڵێت : ئەو پێغەمبەرەی نێرا هەواڵی دا بە ( طالوت) کە تەوبەی لێ وەردەگیرێت ، ئەو پێغەمبەرەش ( اليسع أخطوب) بوو ، وەهەروەها ( ابن جرير) گێڕاویەتەوە ، وە ( الثعلبي ) باسی کردووە کە هێنانی بۆ لای گۆڕی ( شمویل) و سەرزەنشتی کردووە ، لەزەوی‌یەوە کردوویەتی ، ئەمەیان ( أنسب) ترە . وە لەوە دەچێت لەخەودا بوبێت کە هەستابێتەوە لەناو گۆڕەکەی ١.١ نەك بەڕاستی هەستابێتەوە بە زیندوویی ، کەئەمەش موعجزەیەکی پێغەمبەرایەتی‌یە وە ئەو ئافرەتە پێغەمبەر نەبوو .. والله تعالى اعلم ، (ابن جرير ) دەڵێت : ئەهلی

تەورات بانگەشەی ئەوە دەکەن کە ماوەی پاشایەتی ( طالوت ) تاوەکو کوشتنی خۆی لەگەڵ کوڕەکانیدا ( ٤٠) ساڵ بووە .. والله تعالی اعلم ٠

## پەندو ئامۆژگاری

### پەندی بەسەر هاتی ( حزقیل ) علیە السلام :

لەبەسەرهاتی ئەم پێغەمبەرەو قەومەکەی پەندی گەورەی تیادایە بۆ ئەو کەسانەی دڵەکانیان هەردەم کراوەیە بۆ پەندو ئامۆژگاری ئەو کەسانەی خوای گەورە بە فەضل و ڕەحمی خۆی هیدایەتی داون بۆ ڕێگەی باوەڕو ڕێگای بەختەوەری ، قەومەکەی ( حزقیل) خوای گەورە دەردێکی کوشندەی تیادا بڵاو کردبوونەوە جالە بەهۆی گوناهیان بوبێت یان لەبەر هەر شتێکی تر بێت ، ئەم قەومە دیارە باوەڕیان بەوە لاواز بووە کە ئەگەر خوای گەورە ش... نەسیبێت لە چارە هەر دەبێت ببێت .وایان دەزانی ئەگەر لەو دێیە هەڵ بێن ئیتر کۆتایی نایەت بە ژیانیان ، نامرن بەڵام کاتێك دەرچوون یەکەم جار پاشان هاتنەوە دوای ئەوە ئەو کۆمەڵە کەمەشی کە مابونەوە ئەوانیشیان هێنایە ئاستی بۆ چوونەکەی خۆیان بۆیە وتیان گەر ئەم طاعونەکە هاتەوە ناو گوندەکە ئێمەش هەڵ دێین بۆیە بروا خوشکانی باوەڕدار چاو لی کردن دەردێکی سامناکە بەتایبەت بەبێ زانیاری بێ چاو

ڕۆشنی وە بەداخەوە زۆرێکمان ئێستا لەموسڵمانان توشی ئەم دەردە بوین وە هەندێکمان چاولێ کردنی کۆمەڵە گومڕاکان دەکەون و قەوانی بەتاڵەکانی ئەوان لێ دەدەنەوە ووشەو زاراوەی جۆری ئەوان دەڵێنەوە ئەمە ئاینی خوای گەورەیە و شتێکی تازە نی‌یە وە شتێکی ئەوەندە هەڵوەشاو لاواز نی‌یە تاوەکو بۆ چونمان وا بێت کەئەگەر ئاوانەکەین و ئاوا نەبین کەس موسڵمان نابێت یان دەڵێن ئاین شیرین دەکەین لایان ، باشە ئایا ئاین تاڵە ؟ ئاین ڕووکەش و ناوەوەی داڕزاوە تا بۆیە بکرێت ؟ پاش ئەوە بۆ جاری دووهەم طاعونەکە بڵاوبۆیەوە و هەموان لەدەست قەدەری خوای گەورە هەڵ هاتن نەیان دەزانی ﴿ أينما تكونوا يدريككم الموت ولو كنتم في بروج مشيدة ﴾ پاشان گەشتنە ئەو شوینە بەڵام نەیان زانی کەوا خۆیان بەپێی خۆیانڕایان کرد بۆ ئەو شوێنەی ڕۆژیان تیایدا تەواو دەبێت ، خوای گەورە فەرمووی بمرن دەست بەجێ مردن چونکە ئەو ڕۆح و لاشەیە پەروەردگار خۆی خاوەنی‌یەتی و زیان سود بۆ ئەو لاشەیە هەر پەروەردگار پێی دەبەخشێت ، لای دەبات لەسەری . ئەمەش پەندێکە بۆ ئێمەی باوەڕدار کە خوای گەروە هەموو شتەکانی لە

( لوح المحفوظ) دا نوسیوە وەك دەفەرموێت﴿ الم تعلم ان الله یعلم ما في السموات والارض ان ذلك في كتاب ان ذلك على الله یسیر﴾ [١]

وە هەروەها لە صحیح مسلم ، عن عبدالله بن عمر و بن عاصی رضي الله عنهما قال . قال رسول الله ﷺ ﴿ كتب الله مقادیر خلائق قبل أن یخلق السموات والأرض بخمسین ألف سنة ﴾ [١] وە هەر سونەتێكی پێغەمبەری خوایە كەكاتێك شتێك ڕوو ئەدات نەڵێین ( ئەگەر وامان بكردایە وانەدەبوو ) بەڵكو دەبێت بڵێین ( قدر الله وما شاء فعل) ئومە ووتەی بڕوادارە .

پاشان پەندێكی گەورە و بەڵگەیەكی تری ئەوەیە تایدایە كە خوای گەورە مرۆڤ دەمرێنێت و توانانی زیندوو كردنەوەشی هەیە و زۆر ئاسانە لای خوای گەورە هەر ئەوەندە خوای گەورە فەرمانی كرد كە بمرن مردن و وە فەرمانی كرد كە زیندوو ببنەوە زیندووبوونەوە ، وە خوای گەورە لەبەر چاوی هەندێك پێغەمبەردا مرۆڤی مردووی زیندوو كردۆتەوە یان گیانی لەبەرانی تر كەلەم بەسەرهاتەدایە یەكێكیانەوە هەروەها بەسەرهاتی (ابراهیم ) كە باڵندەكانی پارچە پارچە كردوو هەریەكە لەسەر كوێرێك داینان و پاشان خوای گەورە زیندوویی

---

[١] الحج : ١٧٠ .

[١] رواه مسلم ، كتاب القدر ، ذكر حجاج أدم و موسى علیهما السلام

کردنەوە ، یان بەسەرهاتی (عیسا ) علیە السلام کە مردووی زیندوو کردۆتەوە ، بەفەرمانی خوای پەروەردگار •

پاشان پەندێکی ترو سونەتێکی تر ئەوەیە کە مەردەم بیر لە دروست کراوەکانی خوای گەورە بکەینەوە لەو شوێنەوارو پاشماوەو قەومەکانی ترو بەسەر هاتەکانیان بیر بکەینەوە و پەندی لێ وەربگرین ، ( حزقیل) وەك هەروو باوڕدارێكی ڕاستەقینە و پێغەمبەران ئەی ڕوانیە پاشماوەی قەومەکەو ئێسکەکانیان وە زۆر پێی خۆش بوو کە خوای گەورە لەبەر چاوی خۆیدا زیندوویان بکاتەوە ،وەئەوەش فەضل و ڕەحمێکی خوای گەورەیە بۆ ( حزقیل) علیە السلام کە هەمویانی بانگ کرد بەفەرمانی خوای پەروەردگار و زیندووبوونەوە،

خوای پەروەردگار دەفەرموێت ﴿ قل سيروا في الارض فانظروا كيف كان عاقبة الذين كانوا من قبلكم ﴾ وە هەروەها ﴿ أعظكم بواحدة أن تقوموا الله مثنى وفرادا ثم تتفكروا ﴾ وە ئایەتی پیرۆز زۆرە لەم بارەیەوە •

## پەندی بەسەرهاتی

## ( الیسع ) علیە السلام

هەروەها لە خوێندنەوەی کورتی بەسەرهاتی ( الیسع) علیە السلام ئەومان بۆ دەردەکەوێت کەلەسەردەمێکی ستەم و لادان و

تاوان کردندا هاتووە وە خەڵکی چاوڕۆشن کردوە بەزانیاری ئاین ، وە خۆشی زۆر پەیوەست بووە بە خواپەرستی و فەرمان کردن بەچاکە و ڕێ گری کردن لە خراپە و وە هەروەها دەست بەرداری شەریعەت و بەرنامەی خوای گەورە نەبووە ، وەکو هەموو پێغەمبەران ئەرکی سەرشانی خۆیی ئەنجام داوە .

ئێمەی بڕوادار هەردەم دەبێت بێ ئاگانەبین لەشەریعەتی پەروەردگار وە دەبێت پەیوەست بین پێیەوە و لە لۆمەی لۆمەکارانیش نەترسین چونکە خوای گەورە ڕۆزی دەرو ژیان و مردنی دروست کراوەکانی بەدەستە وە ئەگەر هەموو سەرزەوی کۆببنەوە لە دژت ناتوانن زیانت پێ بگەیەنن مەگەر ئەوە نەبێت کە پەروەردگار لە چارەی نوسیبێت ، وە کۆمەك و سەرکەوتن هەرلای پەروەردگارەو هەموو کاروبارەکانی تر .. باشە گەر ئێمە ئەوە بیروباوەڕمانە ئیتر بۆ دەبێت ئاسان کاری بکەین لە حەرام کراوەکانی خوای پەروەدگار ( والعیاذ بالله) یان بۆ دەبێت بچینە سەر کورسی و لەپاڵ بێ باوەڕاندا قسەی ئەوان بکەین یان بۆ دەبێت هاوبیری خۆمان دەربڕین بۆیان ؟ ئەی نازانن دۆستایەتی و دوژمنایەتی لە پێناوی خوای گەورەدا بەشێکە وەك هەموو بەشەکانی تری بیروباوەڕ؟ یان یان یان .. ......

تەنها لەبەر ئەوەی خەڵکی پێمان ئەڵێن ( درۆنن ) و (شێت) و ( توندڕەو ) و ( کۆنەپەرست) باشە وەلامتان چی یە بۆ ئەو ووشە ناشیرینانەیەی کە بە پێغەمبەریان دەوت ؟ ئایا ئێوە بەڕێز ترو ئازیز ترو نرخ دارن لە پێغەمبەری خوا : بێ گومان بە خۆڵی ژێر پێ ی نابن نەك خۆی ، بۆیە براو خوشکانی باوەڕدار ئەو کەسانەی بەڕاستی دەستیان گرتووە بە قورئان و سوننەتەوە ، قۆڵی باوەڕی بۆ هەڵماڵن بۆ چاکەخوازی و بڵاوکردنەوەی ئەم ئایینە پیرۆزە و نەفس و ماڵ و کەستان بپارێزن لەو ئاگرەی ئامادە کراوە بۆ بێ باوەڕو ستەم کاران ، کێ بێ لەوە ستەم کار تر بێت کە هاوبەش بۆ خوا بڕیار دەدات و کێ بێت لەوە ستەمکار تر بێت کە هەوڵ دەدات ئاین تەشەنە نەکات ، لەنەفس و کەس و ماڵیاندا جێبەجێ ی ناکات ؟

بۆیە براو خوشکانی باوەڕدار ئامۆژگاری خۆم و ئێوەش دەکەم بەپەیوەست بوونی ڕاستەقینەوە بە قورئان و فەرموودە پیرۆزەکانی پێغەمبەری خواوە با هەموو سەرزەوی ش لێتان زویر بێت ، ئەمە تەنها ڕێ ی چارەسەر کردنە بۆمان بۆئەو دەردەی کە بڵاوبۆتەوە تیاماندا وەخوای گەورە دەفەرموێت ﴿ اطیعوا الله ورسوله ﴾ وە هەروەها باوەڕمان تەواو نابێت تا وەکو پێغەمبەر ﷺ نەکەین بەحەکەم تاکاریش نەکەین بەوەی هێناوی یەتی

لەپەروەردگارەوە ڕزگارمان نابێت و سەرفراز نابین ( **فلا وربك لا يؤمنون حتى يحكموك فيما شجر بينهم ثم لا يجدون في انفسهم حرجا مما قضيت ويسلموا تسليماً** ) ٠

پەندی بەسەرهاتی پێغەمبەر ( شمویل ) علیه السلام :

لەبەسەرهاتی پێغەمبەر ( شمویل) علیه السلام) دا پەندو ئامۆژگاری زۆر بە پێزی تێدایە سەرەتا بردنی بۆ لای مامۆستایەکی خواپەرست تاوەکو ڕێی چاکە خوازی و پەرستنی خوای گەورە ببێتە شتێکی چەسپاو لە ناخی دا ئەمەش چاکی دایکی بوو کە ئافرەتێکی لە خواترس بووە ، بۆیە خوشکانی باوەڕدار بەم شێوەیە دەبێت بەتەنگ پەروەردە کردن و گەورە کردنی ڕۆڵەکانیانەوە بن نەك هەر بە منداڵی پۆشاکی ناشەرعی و فێری ووتەی نابەجێ بکرێت وەك لەم ڕۆژگارەی خۆماناد گەرمنداڵەکەت پۆشاکێکی شەرعی بپۆشێت خەڵکی دەڵێن ( کەی وەختی ئەمەیەتی ) ئەی باشە وەختی پۆشاك و دیاردەی گاورو جولەکەیەتی ؟ ئەوەیان خوای گەورە لێی ڕازی نییە و ئەمەشیان پۆشاکی خواپەرستان و داوێن پاکانە ،هەروەها پەندێکی تر کەئەوەیە هەر قەومێك دەست بدەنە خراپەکاری خوای گەورە چی سەربەرزی و غیرەت و بنەمای چاك هەیە لێیانی دەسەنێتەوە ، وەك بنی اسرائیل کە دەستیان

بە خراپەکاری کرد خوای گەورە تابوتەکەی لەدەست کردنەوە کە خێرو بەرەکـەتی زۆری تیـادا بـوو بۆیـان پاشـان تانەگەڕانـەوەو خۆیان چاك نەکرد و هەوڵیان نەدا دەستیان نەکەوتەوە ٠

هـەروەها داواکردنـی جیـهاد کـردن لـە خـوای گـەورە کـە کـاتێك مۆڵەتی دا پـێیان و کەسێکی چاکی کرد بەسەرۆکاریان پشتیان لەو داوایە کرد و بوونە ستەمکار ، ئەمەش لەناو ئێمەدا ڕەنگی تـەواوی داوەتـەوە ئـەوەی گرنـگ نـەبێت ئـەمڕۆ لای زۆربـەی موسڵمانان هـەوڵ نـەداو تـێ کۆشـانە بـۆ گەڕانـەوەی حوکمـی پـەروەردگار ، ئەمـەش چارەسـەرێکی تـەواوی کێشـەکەمانە کەئەویش جیهاد کردنە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت ﴿ لا ینجبوا منه الا من عرف دین الله ، فجاهد علیه بقلبه ولسانه ﴾ وە هـەروەها خوای گەورە دەفەرموێت ﴿ الا تنفروا یعذبکم عذاباً الیما ویستبدل قوماً غیرکم ولا تضروه شیئاً والله علی کل شیء قدیر ﴾ التوبە ٣٩

پاشـان تـاقی کردنەوەکـەیان لەسـەر ڕووبارەکـەوە دەستنیشـان کراوە پێغەمبەرەکەیان فەرمانی پـێ کردن لەو ڕووبارە نەخۆنەوە چونکە لەناویان دەرئەچن و نایان بەن لەگەڵ . زیاندا بۆ جیهاد کردنەکە دەڵێم : جیـهاد کـردن و تـێ کۆشـان ئـارام گرییـەکی زۆری دەوێـت هـەروەها پەیوەسـت بـوون بە فـەرمانی خـوا و پێغەمبەرەکەیەوە و لەبەر چاوبوونی پاداشتی ڕۆژی دوایی دا ،

وەهەروەها موجادەلـە کردنیـان لەگـەڵ پێغەمبەرەکـەی خۆیـاندا لەسـەر دەسـت نیشـان کردنـی ( طـالوت) کـە خۆیـان داوایـان کردبوو وە بەڵگەی شیاو نەبوو ئەم کەسە ئەوە بووە دەیان ووت بـێدەرامەتەو لەنەوەی پاشایەتی نییـە و قسـەیان زۆر دەکـرد ، ئەمەش دەردێکە لـەزۆرماناد هەیـە بەرامبـەر ئـەو فـەرمان و ڕێ گریانەی لە ئیسلامدا هەیە خوای گەورە دەفەرموێت ﴿ ماکـان للمؤمن اذا قضی الله ورسـوله امراً ان یوکـون لهـم الخـیرة من امرهـم ﴾ دەبێت باوەڕدار هیچ قسەیەك نەکات لە فـەرمان کردنـی خـوای گەورە و پێغەمبەرەکەی دا دەبێت بڵێن ( سمعنا واطعنا)

دەڵێـم : هـەر کـەس کـەمێك چاوڕۆشـن و زانیـاری هـەبێت چـاك دەزانێت کە ئەمڕۆ زۆربەی شتەکانی گاور و جولەکە تیامـاندا ڕەنگـی داوەتـەوە وە پێغەمبـەر ﷺ ووتویـەتی شـوێن ئـەوان دەکەون و چاویان لـێ دەکـەن بـێ گومانیش زۆری کۆمەڵەکەمان موفتەلابـە بـەم دەردەوە ، داوا لـە خـوای گـەورە دەکـەین بمـان پارێزێت لەم نەخۆشیانە و پاکمان بکاتەوە لە ڕەفتاری جاهلی و ڕەفتاری گاور و جولەکە خوای گەورە حەشـرمان بکـات لەگـەڵ بـاوەڕداران و چاکـەخوازان و شـەهیدان و پێغەمبـەراندا و لەقیامـەتدا ببینـە هاوڕێیـان ، خـوای گـەورە لەتاوانـەکانمان خۆش بێت و ئیصلاحی حاڵمان بکات ، یارمەتی دەرمان بێت بۆ

هەموو كارێك كەپێی خۆشە و پێی ڕازیە وەئەم نوسراوەش ببێتە تێشویەك بۆ ڕۆژی دوایی و لێمان وەربگیرێت وەبەچاوی خۆمان پێشكەوتنی ڕابوونی ئیسلامی ببینین و خوای گەورە و موسڵمانان ڕاست بكاتەوە لەو هەڵانەی دەیكەن وە لەئاینەكەیان شارەزا بكات و هەموان كار بەو شەریعەتە بكەین ( انــه سميــع مجيب قريب ) •

(( وصلى الله وبارك على محمد وعلى آله وصحبه وسلم ))

﴿ سبحانك اللهم وبحمدك أشهد ان لا اله الا انت استغفرك وأتوب اليك ﴾

